# سەرەوژێری

کوومەهەڵبەس

رێوار ئاودانان

پێشکەش ڤە ″ژینا″ و گرد ئانەیٚ ک وە خین خوەیٚان، هەڵبەس ″ژن ژیان ئازادی″ نیسەنن

تقدیم به «ژینا» و همه‌ی آنانی که با خون خود، شعر «زن زندگی آزادی» را نوشتند





ناسنامەیٚ پرتووک

ناو پرتووک: سەرەوژێری

کوومە هەڵبەس کوردی

بڤەش: رێوار ئاودانان

وەشنگە: چیا

یەکم چاپ: ٢٧٢٢ کوردی / ١٤٠١ هەتاوی

---

مشخصات کتاب

نام کتاب: وارونگی

مجموعه شعر دوزبانەی کُردی ـ فارسی

شاعر: ریوار آبدانان

نشر: چیا

چاپ نخست: ۲۷۲۲ کُردی / ۱۴۰۱ خورشیدی

## ❊ گوڵنارەل خینالین

ژینا، نیکا، سارینا...

ڤە هەر ناوێ چرمەت

گوڵنارێک وشکێ!

## ❊ گُلنارهای خون‌آلود

ژینا، نیکا، سارینا...

به هر نامی می‌خوانم‌ات

گُلناری می‌شکفد!

## ❊ ڕێیەگەێ خوەر

"ژن، ژیان، ئازادی"...

ئەگەر پرسیار ناونیشان خوەر کەی

هەر وە هناز ئێ ئاوازە بچوو

## ❊ راه آفتاب

«زن، زندگی، آزادی»...

نشانیِ آفتاب را اگر می‌پرسی

رو به همین آواز رَو

## ❇ هەیک گێس ژن، ئەژ گولە ئازدارترە!

فیشەکەل

هەرچی ڤە پرتاف‌تر دچن

بڕ هۆچ شوونێ نەیکەرن...

هۆ سەربازەکەێ شەکەت

ک زەردەخەنەت بوو ئاگر و barووت دێ!

خێیاوان، پرچ شوورِ ژنێکە

رەشەبایێش ئەڵبکەری

شوون‌پاێ ئەڤین ڤەت نەیسرِێ.

## * وقتی گیسوی زن، پُرتوان‌تر از گلوله است!

گلوله‌ها

هرچه پُرشتاب‌تر می‌روند

به هیچ جایی نمی‌رسند...

آی سربازِ خسته

که لبخندت بوی آتش و باروت می‌دهد!

خیابان، گیسویِ بلندِ زنی‌ست

توفان هم برانگیزی

ردّپای سُرخِ عشق را نمی‌توانی پاک کنی.

## ❊ ئاهـ

ئێ واوەڕووە
هەرئەو "ئاهـ"ـەسە...
ئاهـ پەرپریکێگ
ک باڵەیلێ شکانین

## ❊ آه

این توفان
همان «آه» است...
آهِ پروانه‌ای که
بال‌هایش را شکستید

## ❊ شووڕش گوڵ

خوێن گوڵ رژیا

لافاو ئەڵسیا!

## ❊ انقلاب گُل

خونِ گُلی ریخت

سیلاب برخاست!

## ❊ سۆرترین گوڵدەم

"ژن، ژیان، ئازادی" ــ
ئەژ ناو گرد گوڵدەمەیل ساڵ
سۆرترین هەر یەسا

## ❊ سُرخ‌ترین شکوفه

«زن، زندگی، آزادی» ــ
از میان همه‌ی شکوفه‌های سال
سُرخ‌ترین همین است

## ❊ چارەنقیس سۆەر

کراسەیل

له لەش کوردەیل

دترسن!

هەمیشه مەترسیی گوله و تیرواران هەس.

## ❊ سرنوشت سُرخ

پیراهن‌ها

از تنِ کوردها

می‌ترسند!

همیشه خطرِ تیرباران و گلوله هست.

## بەرزەک بێدەنگی

بەرزەک

هەر ئێ بێدەنگیی گەورایێ تنەسە

ک لە نامێ

نە دەرانەیْک وەرەو "ئەرێ" ئەوکریایە و

نە دەرانەیْک ژە لایێ "نە"

بەسریەد...

بێپەرتخێگ ک لەناوێیا

دیمەن، هەر خود چاوەنووڕییە

دارالووس

دە ناوەیْن ئاگر و

رچیان.

## ❋ برزخِ سکوت

برزخ

همین سکوتِ بزرگِ توست

که در آن

نه دروازه‌ای رو به «آری» گشوده است و

نه دروازه‌ای از جانبِ «نه»

بسته می‌شود...

بی‌نهایتی که در آن

چشم‌انداز، خودِ انتظار است

معلّق

میانِ آتش و

انجماد.

## ❊ وێنەیٚ نیمەچڵنگ

هەم ئەو رەشەوایٚ گرژە

ک وێیەرد و

هەم ئیٚ دار هێمنە

ک تا دۆایین وەڵگ، زەردەخەنە کردێیە

منم.

بەڵام وەداخەو!

جامەکەیل، هەمیشە نیوەێگ ژە من نیشان دەن و

لە هەر لاێگا وەرەو خوەم گلەو بخوەم

وێنەێگ وە جی دمینیٚ

ک دی هاوچەشن هۆچ کەس نییە.

## * تصویرِ ناتمام

هم آن تُندبادِ خشمگین

که گذشت و

هم این درختِ آرام

که تا آخرین برگ، لبخند زده

من‌ام.

ولی افسوس!

آینه‌ها، همیشه نیمه‌ای از مرا نشان می‌دهند

و از هر سمتی رو به خودم برگردم

تصویری جا می‌ماند

که دیگر شبیه هیچ کسی نیست.

## ڤەژین

تەڵڤەنەیَ خوەم
ناو ئاێنەیَ چکچووڵێ منەی دکردم
ک گلارەیَ چەوەل هۆچ کەس نەڤی
کات، بیَئەژم بی و
هناز، کڕکپ.
دەسێک، بەردیَ خسە ناو گوڕیی دڵم
ئەژ مەرگ ئەڵسیام
دیم ک تونم!

## ❉ دوباره زیستن

آواره و سرگردانِ خویش

جستجو می‌کردم درونِ آینه‌ی سوت‌وکوری را

که مردمکِ چشم‌های هیچ کس نبود

زمان، بی‌شکل بود و

جهت، مسدود.

دستی، سنگی در برکه‌ی قلبم انداخت

از مرگ برخاستم

دیدم که تواَم!

### ❊ دۆری

له هەیمەیی ناونی دەسەیل ئیمە

پرچ چەن کاکیشان چەرمگەو بۆ؟!

### ❊ دوری

در فاصله‌ی میانِ دست‌های ما

گیسویِ چند کهکشان سفید شد؟!

## ❊ چیرووک

ت وا بۆت

بۆمە وەڵگ.

واران بۆت

بۆمە رەنگ.

ئێ چیرووکە لە هەر لایگەو بخوەنیدەێ

پەرتخێ هەر پایزە!

## ❊ قصّه

باد بودی

برگ شدم.

باران بودی

رنگ شدم.

این قصّه را از هر طرف که بخوانی

پایانش همیشه پاییز است!

## ❇ بەدماژە بیین

دارستان، دڵەپرتەیٚ گەپێکە

هەر گوڵوەچ، گازگەورێک دواژە و

هەر وەڵگ، وڕینەێکە ــ

هەر ژە ئەو شەوە ک

دەسەیل، بوو تەوەر گرتن

تا زام باڵایٚ دار

بووە سێدارە.

## ❊ مسخ

جنگل، دلشوره‌ای بزرگ است

هر شکوفه، کابوسی دوباره و

هر برگ، هذیانی‌ست ــ

از همان شبی که

دست‌ها، بوی تبر گرفتند

تا زخمِ قامتِ درخت

دارِ اعدام شود.

## ❊ پژکێ ک رچکیا

ئاێنەل جەهان

پەنجرەل ڤەسەێکن

تا ڤەرەڤ "نەڤیین"ـت چەکنمۆ

باێ دەرێکەم

... ئۆ ئەڤەێک مینێیە جا

تەنیا، ڤێنەێکە

ک پژک پرسیارێک

ئەڵسەر لەڤەلێ

کوتپڕ رچیاێە.

## ❋ شکوفه‌ای که یخ زد

آینه‌های جهان

پنجره‌هایی بسته‌اند

همین‌که رو به «نبودن»‌ات بازشان می‌کنم

باد مرا می‌برد

... و آنچه جا می‌ماند

تنها، تصویری‌ست

که شکوفه‌ی پرسشی

بر روی لب‌هایش

ناگهان یخ زده است.

## ❊ ئامووژگاریی چووشخاتەیگ ک تا دما هناسە سزیا

گلەییێک لە تیەریکی نییە؛
بەڵام گەرەک تەریقی بکیشی
ژە "چرا نەبۆن" خوەت...

## ❊ پندِ چوب‌کبریتی که تا آخرین نَفَس سوخت

از دست تاریکی گله‌ای نیست؛
از «چراغ نبودنِ» خود اما
شرم باید کرد...

زەلکاوەلیش زەردەخەنە کەرن

ماسی بیچگڵە!

بەڵام رخد نەچوو

دەریا، لە چیرووکەگان ئیمە گەوراترە

ئوو ئیٚ گازڕانەیلە

سەرەنجام لە بنەڵبن ژەویرچیین، تاێرمە دەن.

زەلکاوەیل فریٚودەرن

بەڵام ت مل ریٚیەکەت بگر و بچوو

ماسی بۆچگڵە!

ئەو چشتە ک هایدە شوونیٚ

دماگل ت وەدی کەیٚ.

## ❋ راه حقیقت

مُرداب‌ها هم لبخند می‌زنند

ماهی کوچولو!

اما نترس

دریا، بزرگ‌تر از قصّه‌های ماست

و این کابوس‌ها

سرانجام در اعماقِ فراموشی، ته‌نشین خواهند شد.

مُرداب‌ها اغواگرند

اما تو راهت را برو

ماهی کوچولو!

آن چیزی که در جستجوی آنی

عاقبت، تو را پیدا خواهد کرد.

## ❊ ئامووژیاریی مەتەڵڤەش پیرەێ

**دارسۆن دماڕوو، دەناو تۆم خەوسەێ ئمڕوو هناس کێشێ**

**ئەژ ڤیر نەڤەر: هەر خێیاڵ، درەخت سەوٚزێکە!**

## ❊ پند یک قصّه‌گوی پیر

**جنگلِ آینده، درونِ بذرِ خُفته‌ی امروز نَفَس می‌کشد**

**از یاد نبر: هر رؤیا، درختی سبز است!**

## ❊ سەرەوژێری

تیشک و تریفەیلێ هەس

ک تیەریکم کەن!

ئوو جارجار،

ئەو وا ک ئڕا کوشانن چرا هاتگە

رێنمایکەرێک راسکانییە.

## ❊ وارونگی

نورهایی هست

که تاریکم می‌کنند!

و گهگاه،

آن باد که به کُشتنِ چراغ آمده است

یک راهنمایِ حقیقی‌ست.

## ❊ گەشبینی

**کووف سەرد ئەڵنەکێش!**

**لەتە تاریکەگەۆ مانگ، ئەرەۆ نەدیینە.**

## ❊ خوش‌بینی

**آهِ حسرت نکِش!**

**نیمه‌ی تاریک ماه، برای ندیدن است.**

## ❊ ئافراندن

ئەژ بێدەنگیی قەڵ بەردێ

تۆنی پەیکەر قسەکەرێ بتاشی

ئوو پارچە زەوینێک سووتیاگ

بکەیە کێڵگەێ پڕپیتێ.

وە لیسکێگ

تۆەنی قەشەنگیی هەشاربۆە دە بن تیەریکی ئەڵکیشی

ئوو لە رەنج

چارەنۆسێگ لێواولێو ژە شادییەیل بنۆسی.

هەنایێ "چۆ تواسن" ت

وەگەرد "شێواز ببین" ئەۆ

بپووڕێ

ئوو ناوەگەێ ترەک یە، "ئەوین"ـە.

## ❊ آفرینش

از سکوتِ تکّه سنگی

می‌توان تندیسِ سخنگویی تراشید

و قطعه زمینی سوخته را

به کشتزاری پُربرکت مبدل ساخت.

با پرتوِ نوری

می‌توان زیباییِ پنهان‌شده در ژرفنایِ تاریکی را برکشید

و از رنج

سرنوشتی سرشار از شادی‌ها نوشت.

آنگاه که «چگونه خواستنِ» تو

با «شیوه‌ی بودنِ» او

هماهنگ شود

و نامِ دیگر این، «عشق» است.

## ؟

لیپاوەیل وێیەردە
هن منن
ئوو قایخەیل باێەوانیی بۆچک
وەرد کوو ڕێوارەیل بژناس.
لیپاوەیل لە بەرزیی ڕەپاوڕەپ و ئاشکرایٚ گابەردەیل
وە چوارمێخە کیشریەن و
قایخەیل
دە لەنگەرگەیل شڕ و چووڵهووڵ
ئارام ئارام لەنگەر گرن.
م
وەگەرد لیپاوەیل و
قایخەیل باێەوانیی بیچکم
دەریاێگم
نیقەڵتووز گیانەوەرەیل بۆچک و پڕ ژمار پرسیارەیل
ک خوەیان خزاننە قۆلایی سەوز دێز ئاوانم.
دچمەو نوا
وەلەف.

**ژە "کووردا"ـێ هاتمە**

**تا بچمە "کووردا"ـێگ**

**وەگوڕەگوڕ**

**ئەژ خوەم**

**وەرەو خوەم!**

**ئەوەێ ک دە ئاسووەیل وەراوەر**

**لە هڵاتن واژاوەێ وەدی تیەێ**

**منم**

**ک تا دۆرتر لە "م" نیشتێیە.**

**هەر ئەوجوورە ک دە ئاسووەیل پشت سەر**

**ئەوەێ ک لە خوەراواێ واژاوەێگ ئەڕا رەوانە کردنم وساگە**

**منم**

**ک تا نزیک‌تر لە "من"ـە!**

**... لیپاوەیل ئێرنگە**

**هن منن**

**ئوو قایخەیل بایەوانیی بیچک**

**وەرد کوو رێوارەیل نەناس.**

**گاهس رووژێ ک لیپاوەیل**

**ژە بەرزایی لێڵ و گۆنگ گابەردەیل بانان داوەزن و**

قایخەیل

دە لەنگەرگەێ ئەژ جوگرافیاێ "هەبوون یا نەبوون"

سەفەرێک نوو بنیا بنەن،

نەهەنگەیل هێمن

ئەڵ پانتایی ئاوان سەوز دێزـ واشم

ورسییەرییان شکانۆن!

❋ ؟

خیزابه‌هایِ گذشته

ازآنِ من‌اند

و قایق‌هایِ بادبانیِ کوچک

با انبوهِ مسافرانِ آشنا.

خیزابه‌ها بر ارتفاعِ صریحِ صخره‌ها

مصلوب می‌شوند

و قایق‌ها

در اسکله‌هایِ فرسوده و خلوت

آهسته‌آهسته پهلو می‌گیرند.

من

با خیزابه‌ها

و قایق‌هایِ بادبانیِ کوچک‌ام

یکی دریایم

سرشارِ جانورانِ کوچک و پُرشمارِ پرسش‌ها

خزیده در ژرفنایِ سبزِ تیره‌ی آب‌هایم.

پیش می‌روم

**موّاج.**

**از «کُجا»یی آمده‌ام**

**تا به «کُجا»یی رَوَم**

**غرّان**

**از خود**

**به خود!**

**آن‌که در افق‌هایِ پیشِ رو**

**در طلوعِ مکرّری زاده می‌شود**

**من‌ام**

**که تا دورتر از «من» نشسته است.**

**همچنان‌که در افق‌هایِ پسِ پشت**

**آن‌که در غروبی مکرّر به بدرقه‌ام ایستاده**

**من‌ام**

**که تا نزدیک‌تر از «من» است!**

**... خیزابه‌هایِ اکنون**

**ازآنِ من‌اند**

**و قایق‌هایِ بادبانیِ کوچک**

**با انبوهِ مسافرانِ ناشناس.**

**شاید روزی که خیزابه‌ها**

**از فرازِ گُنگِ صخره‌هایِ آینده فرود آیند**

**و قایق‌ها**

**در اسکله‌ای از جغرافیایِ «بودن یا نبودن»**

**سفری نو بیاغازند،**

**نهنگ‌هایِ آرام**

**بر گستره‌ی آب‌هایِ سبزِ تیره‌فامم**

**گرسنگی‌شان را فرونشانده باشند!**

## ❊ سەفەرێگ ژە قۆلاییەگان

وەل کۆچەباخەگان وایا ئاشناترم!
ئوو وەرد هەوش‌خەڵوەت پەپوولەیلا
ک ئاسمانە!
چەوەیلم ــ ئی تیرئاسارەیل سزیایە ــ
رێویارەیل "کوومەڵەــ هەسارەێگ لە پەرتخ فڕین"ــن
لەورە ک
هەواگەێ ئاوس و هەڵگر "بارسایی رەوان راسی"ــیە.
حەح!
گوپکەیل هۆرم چ بوو "هەڵگەردیان لە مەودایل"ــێ دێرن!
ئوو دڵم، هامچڕەێ لاڵکە و نقاێ بەرزەچڕەیلە و
هامنەواێ دەنگ گوڵ بەیان ــ ک وەک رووح ئاو نزیکە! ــ
ئگەرد چەم، گیانەڵگیانی‌ترم!
هەێک زڵفەیل شووڕ پڕ ئەژ گوڵدەمەیل کوچگینێ ئەۆکەرێ و
ژەگیانــ وێیەردە،
لەناو قەڵپەنجەێ خاک‌خوڵین تین و گڕۆ، شەهید دووێ.
وەگەرد داران رازێ دێرم
ئەوان داڵگەیل وەدی هاتن دوجارەێ منن!

گەرد ئەور خزم هاوخۆنم و

لەشم قەڵـ یادگارێکه ئەژ تامازروویی هشکەڕوو.

کلکەیلم، زەۆزارەیل پڕاپڕ له گەمن و

ئەڵ برج کڕکپ و خامووش دەنگم

هۆچ داوڵێک پاسەوان نییە.

ئەز ژە راساێ قۆلاییەگان تیەم

له هزارتووەکەێ پێچەڵپێچ وەسەرهات ئاغ و ئەڵسان

ئوو ریشگەیلم، خەوەیل ئەۆڕاسیەتەێ زەمینن!

## ❋ سفری از اعماق

با کوچه‌باغ‌هایِ باد آشناترم!

و با حیاط‌خلوتِ پروانه‌ها

که آسمان است!

چشم‌هایم ـ این شهاب‌های سوخته ـ

مسافرانِ «منظومه‌ای در منتهی‌الیه پرواز»اَند

آن‌جا که

هوایش آبستنِ «حجمِ سیّالِ حقیقت» است.

غنچه‌های ذهنم، عجب بویِ «رجعت از فاصله‌ها»یی دارند!

و قلبم، همسُرایِ نیایشِ زنجره‌هاست و

همنوایِ آوایِ سحرگاه ـ که مثل روحِ آب نزدیک است! ـ

با رودخانه، صمیمی‌ترم!

آنگاه که گیسوانِ بلندِ پُر از شکوفه‌هایِ سنگی‌اش را بازمی‌گشاید و

پاکبازانه،

در حلقه‌ی بازوانِ خاک‌آلودِ اشتیاق و عطش، شهید می‌شود.

با درختان رازی دارم

آنان مادرانِ تولّد دوباره‌ی من‌اند!

**با ابر خویشاوندِ همخونم و**

**تنم تکّه‌یادگاری‌ست از شوقِ کویر.**

**انگشتانم، مزارعِ سرشارِ گندم‌اند**

**و بر بُرج بی‌روزن و خاموشِ صدایم**

**هیچ مترسکی پاسبان نیست.**

**من از امتدادِ اعماق می‌آیم**

**از هزارتویِ پیچ‌پیچانِ سرگذشتِ خاک و خیزش**

**و ریشه‌هایم، خواب‌هایِ تعبیرشده‌ی زمین‌اند!**

## * سروود ژە ویر نەوردەنیی وڵاتێک نەمر

بنوورن وە هەردەبانانێ و

بەڕۆزارەیلێ

وە وەفر سفێد سەرکڵاوان و

رووبارەیلێ

ئوو وە ویر بارنەمان

ئەو رووژەیلە ک دی نەویمن!

ئەی مناڵان رووژەیل بانان شاد.

جوور ئیمە

ک نووڕسیم وە هەردەبانانێ و

بەڕۆزارەیلێ

وە وەفر سفێد سەرکڵاوان و

رووبارەیلێ

ئوو داخ و کەسەر گشت خەڵکان رووژگارانێ

واژا وەدی کردیم

ژە ناخ زەمانەیل و

وە یەێ گڕ!

## ❊ سرودِ فراموش‌ناشدنیِ سرزمینی نامیرا

در کوهسارانش درنگرید و

بلوط‌زارانش

در برفِ سپیدِ چکادها و

رودبارانش

و به یادمان آرید

آن روزها که دیگر نباشیم!

ای کودکانِ فرداهایِ شاد.

چونان ما

که در کوهسارانش نگریستیم و

بلوط‌زارانش

در برفِ سپیدِ چکادها و

رودبارانش

و حسرتِ همه‌ی مردمانِ روزگارانش را

بازیافتیم

از اعماقِ زمان‌ها و

به آنی!

## ❊ دخوازم ئێ جاره، ژه سان بامه دی!

ناخوازم وەڵگ پایزەێ وڵەکەتێک بووم
لەناو دەسەیل تیتاڵباز و خاپوورەکەر وا
ناتوام گیا خەمبارەێ تەنیاێگ بووم
ده ژێر شمرٍ تەرزه و واران
یا گومەلێک هسکوو ئەوتفیاگ ژه دەم شڵپاوەیل
ئاینەیل ئاو، ماوەێگه خەفتنه
بەڵام لەناو بەرد،
کوناواجەێک ئرٍا دیدار خەونەگان هەمیشه هووشیاره
دخوازم ئێ جاره، ژه سان بامه دی
تەڵەبەردێک بووم...
ده سەنگ، نەرمنووڵیی هەس ک له حەریر ئاو نییه
ئوو لەناو هزارتووەگەێ ئەڤ، هەرمانێگ ئەورٍێکەفتەس
کوچگ، گوڵەم ڤەشارتییەیله و
قەشەنگی، قوو چەرمگێک
دەسەڵێن‌نەکردەنی و نەرامدار
ک له پانتایی بێ‌سنوور سەنگ، وه ئارامی ئاڤژەنی ئەکا.
وه رپەرٍپ دڵ بەرد، ئیمان هاوردمه

**ئوو ئەوزێنە و هڕشت قوڵچووخەیل ئەڤین**

**ئەڵ قوڕاتە راقەگان ئەق، باوەڕ کردمە**

**دخوازم ئێ جارە، ژە سان بامە دی**

**تەڵەبەردێک بووم...**

**لەش بەرد، بووخوەش سەرخوەشکەرێ دەڵنێ**

**ک سوورەگوڵ، شێت و شەیدا ئەکا**

**تەمۆرەیل، دەناو کوولیتە دەورێشانەکەێ سەنگ، سەرمەسن**

**ئوو بزەێ قەشەنگ سەرسووڕێنەرێک**

**دەناو چاوەیل بەرد، گوڵوەچ کردێیە**

**ئەچەوە ک دڵ پژکەیل گێڵاس خسێ ڤە رپڕەپ.**

**پەڵنگێک ئاگرین لەناو جەنگەڵ سییەێ سەنگ گاتیەێ**

**شەوگاران بەرد،**

**نقانق ئەژ لوورانەیل دڵڕفێن گوڵووم و ماتاون**

**دخوازم ئێ جارە، ژە سان بامە دی**

**تەڵەبەردێک بووم...**

**دەیشتەگان واران لێدریاگ کوچگ،**

**لەوەڕگەێ ئاسکەیل هۆرشەن**

**ئوو نکەڵمەس ئەژ بوو خوەش کوورپە وەرکەیل دلۆڤانی**

**گەنمجاڕەیل بەرد، گش سەوزن**

**کەژ و کۆەیلێ**

**ئارفانە، لەناو کپیی قۆل ئەوڕەسین، نوقما بۆنە**

**ژیان، ڕەوکەیل سەرکەشێ دێرێ**

**ک دە رێگەل شاراوەێ سەنگ، وە پرتاف دچن**

**ئوو وشەیل بەرد، باڵنەل ڕەوەن و رزگارێکن...**

**ڤە ڤێنەێ ئازادی.**

**هەرگز ئاواز هزارەیل هەڵبەس و یاسەمین**

**ژە قوڕگ بەرد، نەژنەفتیدە؟!**

**دخوازم ئێ جارە، ژە سان بامە دی**

**تەڵەبەردێک بووم...**

**کراس بەرد، زەڕینەوسیمینەێک ئەفسوونکارە**

**ک لە کەوشەنەیل ئاسمان قاقەز نیەگونجێ**

**ئوو قوتییەیل مەداد ڕەنگی و بووم نگارکێشی**

**ئەژ تاو تووڕەیی نگارکێشەل بنکەفتە**

**هەێڤاێنێ.**

**لە پشت ئاسووەیل بەرد، ئقیانووسێک کەو دەنوێنێ**

**ئەورە ک نەهەنگەیل دەریاوان ئەوینار و دڵبەسە،**

**ڤاز ئەوگرنە ناو ئاوەل بێپەێی ژین.**

**چراخەیل دەریایی بەرد، هەمیشە رووناکن**

**ئوو کەشتییەگان لە بارەنازەیل بەختەوەریی ئەڤ**

**لەنگەر ئایشتنە.**

**ئاسمان سان، پڕ ژە ئاسارەیل داگیرسیایَ لاجەوەردە**

**باوەشیَ، دەروەچێگە وەرەو پەڕاڤ هەتاو**

**ئەریَ هەرگز خەنەخەن و گوڵەگوڵ بەرد ئەژنەفتیدە؟!**

**یا هەنهەن خوەرئاوا، ئرمێسەگان بلوورینیَ چنیدە؟!**

**دخوازم ئیَ جارە، ژە سان بامە دی**

**تەڵەبەردێک بووم...**

**هناسەیل گەرم بەرد**

**سروەئاسا ئەڵ گوونایلم ئەڵکەریَ**

**ئوو کلکەیلیَ**

**مێرەوان و ناسیارن**

**وەگەرد پرچەیل پەژارەما.**

**داڵانەیل شاراو سەنگ، م دبەن ئەڕا سەرەتایَ رووژنا**

**ئەڕا وەرز میوەیل رەسیەیَ ئاگر!**

**لەناو بەردا دەس پیَ ئەکەمە فڕین**

**ئوو ئەڕەسمە ژیریی بەرد**

**دخوازم ئیَ جارە، ژە سان بامە دی**

**تەڵەبەردێک بووم...**

**وێشەڵان سەنگ،**

**پەژیراێ گەڵگەل کەمووتەرەیل زانین و ئاگایە**

**ئوو دەنام زڵاڵیی رووبارەیلێ**

**ماسییەگان سوور و سییە، وە هەڵبەزدابەز فەرە**

**باڵەو گرن.**

**ئەرێ هەرگز دەناو باخەگان چڕ بەرد**

**سەیران و گەشت کردیتە؟!**

**قەت لەناو ماڵەکین دڵگر و پاکژ کوچگ**

**مێوانداری لە دووسەیلت کردیتە؟!**

**یا ئێڤاران، دەناو پیادەڕێیەل تەختەپۆشکراو ئەۆ**

**پیارسە کردیتە؟!**

**یە بوو هەزوێلە و ئەترەل جادوویی سان و بەردە**

**ک رەسێیە لیتوپتت!**

**ئەرێ ڤەڕاس، ئەژ مەۆستانەل بەرد**

**ئەنگیر یاقووتی چەشینە؟!**

**یا ئەڵسەر مێز ئەناشتا**

**ڤە پیاڵەێ قاوە و هل، مکێست کردێیە بەرد؟!**

**راشکاوی، لە بەرد فێر بیمە و**

**خەیاڵەیلم ئەژ تاڵەیل ئاورێشم بەرد چنیمە**

**دخوازم ئێ جاره، ژه سان بامه دی**

**تەڵەبەردێک بووم...**

**زەێم بەرد، نیقەڵتووز ئەنگەوین شرین ئەفسانەیلە**

**تۆنی گرد گوورانییەل ئەژڤیرچییە**

**گشت ناوەیل گومەسار**

**گشت گەورا داستانەیل دلێری و ئازایەتی**

**دەناو کڕ ڤە کڕ رۆمان بەرد، وە هۆر باری.**

**هووزەکەم دەناو دیەکەیل وڵات بەرد**

**لەنوو وەدی کەم.**

**لە رووژنای شێرەچراێ هەتاهەتایی سەنگ،**

**خوەم ژە نوو ناسمەو**

**ئوو دزانم ک نەمری و هەرمان،**

**تەنیا چرکەساتێکە لە رووژگاران بەرد**

**دخوازم ئێ جاره، ژه سان بامه دی**

**تەڵەبەردێک بووم...**

## * می‌خواهم از سنگ زاده شوم این بار!

نمی‌خواهم برگ پاییزیِ خسته‌ای باشم

در دستان بازیگوشِ باد

نمی‌خواهم علفِ تنهایِ غمگینی باشم

زیر شلاقِ تگرگ و باران

یا مُشتی ماسه‌ی تُف‌شده از دهان موج‌ها

آینه‌هایِ آب، دیری‌ست خُفته‌اند

اما در سنگ،

دریچه‌ای برای دیدار رؤیاها همیشه بیدار است

می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار

صخره‌ای باشم...

در سنگ، لطافتی هست که در حریرِ آب نیست

و در هزارتویِ آن، ابدیّتی جاری‌ست

سنگ، دریاچه‌ی رازهاست

و زیبایی، قویِ سپیدی

رام‌نشدنی و مغرور

که در وسعتِ بی‌کرانِ سنگ شنا می‌کند آرام.

به تپش‌های قلبِ سنگ ایمان آورده‌ام

و رویشِ جوانه‌های عشق را

بر ساقه‌های سختِ آن، باور کرده‌ام

می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار

صخره‌ای باشم...

عطرِ خلسه‌آوری از پیکر سنگ می‌تراود

که هوش از گُل‌سرخ می‌رُباید

تنبورها، در کلبه‌ی درویشیِ سنگ، سرمست‌اند

و لبخند زیبای شگفتی

در چشمانِ سنگ، شکُفته است

آنچنان‌که قلبِ شکوفه‌های گیلاس را به تپش وا می‌دارد.

پلنگ آتشینی در جنگلِ سیاه سنگ می‌خرامد

شبانه‌های سنگ،

سرشار از زمزمه‌های دلرُبای برکه و مهتاب‌اند

می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار

صخره‌ای باشم...

دشت‌های باران‌خورده‌ی سنگ،

چراگاه آهوانِ اندیشه‌اند

و آکنده از بویِ خوشِ برّه‌های نورسیده‌ی مهربانی

گندمزارانِ سنگ، سبزِ سبزند

کوهستان‌هایش

عارفانه، در سکوت ژرفِ ادراک غوطه‌ورند

زندگی، گله‌اسب‌های سرکشی دارد

که در جادّه‌های پنهانِ سنگ، می‌تازند

و کلماتِ سنگ، پرنده‌هایی روان و رهایند...

مثل آزادی.

آواز هزاره‌های شعر و یاسمن را

از حنجره‌ی سنگ نشنیده‌ای هرگز؟!

می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار

صخره‌ای باشم...

پیراهنِ سنگ، رنگین‌کمانِ افسون‌گری‌ست

که در محدوده‌های آسمانِ کاغذ نمی‌گنجد

و جعبه‌های مداد رنگی و بوم نقاشی را

از هراسِ خشمِ نقاشانِ شکست‌خورده

به گریز وا می‌دارد.

در پسِ افق‌های سنگ، اقیانوسی به کبودی می‌زند

آنجا که نهنگ‌های دریانوردِ عاشق،

در آب‌های عمیقِ زندگی شیرجه می‌زنند.

فانوس‌های دریاییِ سنگ، همیشه روشن‌اند

و کشتی‌ها در باراندازهای خوشبختی‌اش

لنگر انداخته‌اند.

آسمانِ سنگ، پُر از ستاره‌های مشتعلِ لاجورد است

آغوشش، پنجره‌ای‌ست رو به ساحلِ آفتاب

هرگز آیا خنده‌های شادمانِ سنگ را شنیده‌ای؟!

یا اشک‌های بلورینش را وقتِ غروب چیده‌ای؟!

می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار

صخره‌ای باشم...

نَفَس‌های گرمِ سنگ

نسیم‌وار بر گونه‌هایم می‌وزد

و انگشتانش

مهربان و آشنایند

با گیسوانِ اندوهم.

دهلیزهای مخفیِ سنگ، مرا به سرآغازِ نور می‌برند

به فصل میوه‌های رسیده‌ی آتش!

پرواز را در سنگ خواهم آغازید

و به حکمتِ سنگ خواهم رسید

می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار

**صخره‌ای باشم...**

**بیشه‌زار سنگ،**

**پذیرای فوج کبوترانِ آگاهی‌ست**

**و در زُلالیِ رودخانه‌هایش**

**ماهیانِ سرخ و سیاه، پُر جست‌وخیز**

**پرواز می‌کنند.**

**هرگز آیا در باغ‌های انبوهِ سنگ**

**گردش کرده‌ای؟!**

**در آلونکِ باصفایِ سنگ**

**هیچ از دوستانت پذیرایی کرده‌ای؟!**

**یا عصرها در پیاده‌روهای فرش‌شده‌ی آن**

**قدم زده‌ای؟!**

**این بوی ادویه‌ها و عطرهای جادوییِ سنگ است**

**که به مشامت می‌رسد!**

**راستی از تاکستان‌های سنگ،**

**آیا انگور یاقوتی چشیده‌ای؟!**

**یا سرِ میز صبحانه**

**فنجان قهوه و هِل به تو تعارف کرده است سنگ؟!**

**صراحت را، از سنگ آموخته‌ام**

**و خیال‌هایم را از رشته‌های ابریشمِ سنگ بافته‌ام**

**می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار**

**صخره‌ای باشم...**

**کندوی سنگ، پُر از عسلِ شیرینِ اساطیر است**

**همه‌ی ترانه‌های ازیادرفته را**

**همه‌ی نام‌های گمشده را**

**همه‌ی حماسه‌های بزرگ را**

**در سطر سطرِ رُمان سنگ می‌توان به یاد آورد.**

**قبیله‌ام را در دهکده‌های سرزمینِ سنگ**

**باز خواهم یافت.**

**در روشنایِ مشعل جاودانه‌ی سنگ،**

**خود را باز خواهم شناخت**

**و می‌دانم که نامیرایی،**

**تنها لحظه‌ای ثانیه‌وار از روزگارانِ سنگ است**

**می‌خواهم از سنگ زاده شوم این‌بار**

**صخره‌ای باشم...**

## ❊ لوورانەیل دۆایین ١

شانڤەشان نووڕسنم، پیر مەبوو رێگە
ـ ئێ ئەسپ ئسپێی پڕخورووشە ـ
وەلێ م، گشت سەێر و سەمەرەیل سەفەر
لە قاپ ئیسکە تماشا دکەم
گرد باڵگرتنەیل و فیشکەیل سۆەر گڕەکەر
گشت خەون و خەیاڵەیلێ ک شەوەکیان چۆزە ددەن
ئوو لقوپەلەیل سەونز پێڵ، ک وەرەو رووژنای ژیان باڵا دکەن!
شانئەوشان نووڕسنم، پیرەو مەبوو راگە
ـ ئی هیلەهیل سەرکەش هەیتاهەیتە ـ
ئوو ئەز، دە هەر وێستگەێ نواینێ
جامەک نقاونق واران و گوڵوەچێگ، کەرمەۆ دی
ک رووژێ، لەتێگ ژە حەقیقەت م
دە ناو باخچەکەێ بۆچگ خوەێ کاڵۆیی.

## ❊ زمزمه‌های آخرین ۱

دوشادوشِ نگاهم، پیر می‌شود جادّه

ـ این سپید اسبِ خروشنده ـ

من اما، همه‌ی شگفتی‌های سفر را

در قابِ اکنون می‌نگرم

همه‌ی پروازها و فوّاره‌هایِ سرخِ گُدازان را

همه‌ی رؤیاهایی که صبحگاهان جوانه می‌زنند

و شاخه‌های سبزِ پُل را، که به سمت روشنایِ زندگی قد می‌کِشند!

دوشادوشِ نگاهم، پیر می‌شود جادّه

ـ این شیهه‌ی سرکشِ مداوم ـ

و من، در هر ایستگاهِ بعدی

آینه‌ی پُر از باران و شکوفه‌ای را بازمی‌یابم

که روزی، تکّه‌ای از حقیقتِ مرا

در باغچه‌ی کوچکِ خود کاشته بود.

## ❊ پاشخوان

بالْگرتنێک

بێ مەل؛

چەمێک

ژە سان؛

باخێک

پڕ لە بلێسەیل تارسە و وەدی کردن

ئاهـ ! چ پاشخوان شائرانەێکە "مرۆڤ"

وە پرسیارێ ک لەسەر لێوەیل گەردوون چەقیاێە.

## ❋ پاسخ

پروازی

بی پرنده؛

رودخانه‌ای

از سنگ؛

باغی

پُر ز شعله‌هایِ شوق و کشف

آه! چه پاسخِ شاعرانه‌ای‌ست «انسان»

به پرسشی که بر لبانِ هستی شکُفته است.

## * سروو چیین و بیین ڤە...

چیین

سەرەتاێ سرووەکەێ تنە

هەر ئەۋ جوورە ک کووچبار

سەرەتاێ قازقوڵنگەلە.

مەرگ، بوو بەژن و باڵای ت گرێد

بوو خاک

بوو رەنج

ئەتر مرۆڤ

ئوو مردن، دی [ئەژیە دۋا] لە نوورگەێ ئیمە

بەددیمەن و ناشیرین نییە.

کات، لە وڵاتە بەرزەگەێ دڵ تۆ

تا وە هەێ شەوەکییە

تا وە هەێ پاکی.

گیاێ شەونمینێکە

ک هشکەڕێیەل گومان

پڕ کەرێ ئەژ بەرامەێ خوەێ.

ئوو دە ئاسووەیل دەروەچەگەێ ئەوکریاێ نووڕینت

**هانە خەوەر**

**باخەوارەیل گوڵوەچکردەیْ نارینج.**

**دەسەلت**

**دووسەل زەمینن**

**پاچایْ هەراوهەر خاک و**

**سەۆزینە.**

**ئۆ دەرز و لووچەل رەنج فەرهادئاسایْ تۆوڵت**

**گەنمجاڕەل رووژەل بانان.**

**ئەریْ!**

**چیین، بنیایْ سرووەکەیْ تنە**

**هەر ئەۆ جوورە ک وەدی هاتن سەفەر**

**دەسپێک رێیە...**

## * سرود رفتن و شدن

رفتن

سرآغازِ سرود توست

هم از آن دست که کوچ

آغاز دُرناها.

مرگ، بوی اندام تو را می‌گیرد

بوی خاک

بوی رنج

عطرِ انسان

و مرگ، دیگر در منظرِ ما

بدمنظر نخواهد بود.

زمان، در سرزمینِ مرتفعِ قلب تو

همیشه صبح است

همیشه پاکی‌ها.

گیاهِ شبنم‌آگینی‌ست

که راه‌های سنگلاخِ شک را

از شمیم خویش آکنده می‌سازد.

و در افق‌های پنجره‌ی بازِ نگاه‌ات

بیدارند

باغستان‌های نارنجِ شکوفا.

دستانت

دوستانِ زمین‌اند

داستان همیشگیِ خاک و

سبزینه.

و شیارهای رنجِ فرهادآسایِ پیشانی‌ات

گندمزارانِ فرداها.

آری!

رفتن، سرآغازِ سرود توست

هم از آن دست که میلادِ سفر

آغازِ راه...

## ❊ سۆرەگوڵێک دەناو ئاگر

ڕووژەیل، کرچکاڵن و

شەو، چراێگ فرە دۆکەڵکەر

ئەۆدارکردە ئەژ لق لەرزووک هەوەس.

دیوار،

چەمکێگە نزیک وە لاوار

چوارباڵ،

ژە بوو گەنپێس وێرانی پەنگاوپەنگە.

بۆن، ماڵەکە ڤە بەڵگە و پەڕەێ ناسنامەێ دەسکرد دروویین

چۆ هەبۆن سەرەمەرگ خوەێ، وەک مرداوێگ جاڕ دەێد!

پەردەیل،

پەردەیل بێئاگا لە پەلەوەربۆن

خوەرگەل پەنجەرەگە

ئەڕا بەرزەک تیەریکی تاڕاننە و شاروەدەر کردنە

ئوو چراێ ئاینە، کوشیاسەو

گوڕە و هاوار ڕێویارەیل گومبۆەێ دەلیاگان ئەژنەوی؟!

وە وێنەێ سان... وێنەێ ئاغم

**من زەوینم!**

**دووسیامە ئەڵ ئاسانەێ تین و پەێتاو**

**ئوو گیاێ "ئازادی"**

**چی تەوتەم کەڤنێ**

**دە هێمنترین جاگەێ دڵم و**

**هەشارترین قوڕنەل یاێهووشم**

**وە پاک و ناونازار ئەزانم.**

**لاڵکە و نقا کەرم**

**ڤە وشەیل پڕ کەمووتەر و**

**بێدەنگیی کیەو.**

**دووسیامە ئەڵ ئاسانەێ تین و پەێتاو**

**سەرتاپا تەڕ و تلیس!**

**پێڵەیل چاوانم**

**لە ژێر سمکوو ئەسپەیل سەرکێش پەژارە، پەنەمیاێەن**

**هاوشێوەێ ئەو ئاسوور ئاوسە**

**ک دڵ ژە خوان و خواردەمەنییەیل ئاسمان بڕی.**

**چ کەن و وەزەن بکوژێکە ڤەرتەرمەێ چەوەنووڕی**

**بنووڕ لەش چرکەـ گەڵاگان پایزی**

**چۆن لە هسار ماڵەگە ئەوڕزن!**

**له ئاسانەیٚ تین و پەیٚتاو**

**سەرتاپا تەڕ و تلیک وسامە**

**ئاسووەیل دریٚژەپیٚدان کپ و گیریایٚەن**

**ئوو دەشت هەوا لە ژیٚر پەردەیل کەڕکەڕەمزیٚ، قورخ بییە.**

**گزگ‌جاڕەیل پەنجرە هانە کوورە؟**

**لۆتگەیٚ بەرز هەتاو ها کوورە؟**

**نەیٚڤینی میلە و زەنجیرەل، مارش بیٚشەرمیی خوێیۆ**

**چ ڤە ریداری و پیٚلٚی ژەنن؟**

**رازان و چیرووک، تا درەنگانیٚک وەیجوورە بییە و**

**م ئیٚمکە**

**ئەڵ ئاسانەیٚ تین و پەیٚتاو**

**هووسیامە**

**بیٚ ک چەۆەڕیٚی یارمەتیی "یار"یٚ بووم.**

**ئەریٚ! دەسوور وسان**

**وە هۆچ زانسمە و**

**لە داتەکیٚگ خۆماکی سەرپیٚچی کردمە**

**ک مرۆڤ ناچار دکەیٚ**

**تا خوەیٚ لە بلیٚنای بیٚبایٚەخ چیٚژ و خوەشییەیل**

**چوارمیٚخە بکەیٚدن.**

ئەو بەرزەچڕ رۆتەنک و بێخەوش یەێمقومە دۆنید
ک وەگەرد پاکییەیل
وەل تیشکەگان و رووبارەیلا پەیۆەن زۆنەێ درێ؟!
ئەو بڕگەێ رەنگینە ئەژنەوی
ک ژە چگا و گەڕەیل نادیار بەڵام سەوز
چۆ ئەڵکەێد، ئوو خار کەێ
تا نزیکەو بوو... بڕەسێ، ئوو وەل خۆما تێکەڵەو بوو؟!
ئەسە دووارە وە خوەر ئیشم "سڵام"
ئوو بنەتۆمەیل بێدەنگی دەنام لەشم چقیرە دەن
درووددێک هنارم ئەڕا ئازادی
ئوو پەڕەگوڵەیل سۆەر تاسەمەنی، لەناو رەگەیلم دپشکڤن
ئڕا ئەڤین، لەنوو سروودێک دەشم [و گوورانیێگ چڕم]
ئوو وێشییەگان ئاواز، وەرد سروەێ ک لە گیان منا رەوانە
هەڵسن وە هەڵپەڕگە؛
تا داسەیل و داوڵەیل
هەوا بدریەنە هەراهەریی لەهۆرچیینێ لێڵ و کەسنەزان.
... ئاهـ ! من چ لێواولێوم
هەگ
خەیاڵ، خزێیە ناو لار و لەش چشتەگان و

خەسپەن چەم
دەس پێ دکەێ...
ئەژ دەرڤەچەل ئەوکردەێ ئاینە
ئەو خاوارە و کەسنەناس گوجەر خەمگینە دیارە
ک لە ئەولاێ ئاسۆگەل پڕ ژە گوڵوەچ شەوەکیان
وە خوەشڵەخوەشی، گوورانیی نووێ مەچڕێ و
[لە بانان] وەل ئیمەیا ئاشناس.
تەماشاێ ئاینە بکە، تا بانان لە ناوێیا وەدی بکەیت!
پەردەگان سزیەن و
چەوەیل هۆرمان لە نقوڕەیل [، لە کەل و لاکۆڵانەیل بنبەس]
تەڵوەنە و پەشێون.
پەردەگان سزیەن و
دەسەیل دێز و بەدفڕ کارەسات
لە دۆردەس تراوێڵکە، چرچیاێە و هەراسانن.
باڵ گووشماسییەیل، وەرەو رووشتا ئەوکریاێە و
پەلەوەرەل دەریایی، ئاوازخوەنین وژان دەس پێ کردنە.
بژمار!
دەریاپەڕ هەوشەکەێ پشتین ماڵ،
پڕ ئەژ کەلاک و تەرم باێکردەو

**پڕ ئەژ ڕێیەلێ ک ڤە هیچکوو ڕەسنە کووتایی.**

**ئوو م، ئێسە ئەڵ ناوەێن فەقارەیل ڕووناک**

**سەرتاپا فیسیاێە دە لیسک ئەفتاو**

**بەردەڵان تیەریک وەرەو ئەو جیگە ک پێویستە،**

**بڕم و هیلمە جی...**

**سۆرەگوڵێک دەناو ئاگر کردمە ئەۆدی**

**سۆرەگوڵێک دەناو ئاگر کردمە ئەۆدی.**

## * گُل سرخی در آتش

روزها، کال‌اند

و شب، چراغی پُر دود

آویخته از شاخه‌ی لرزانِ هوس.

دیوار،

مفهومی‌ست نزدیک به آوار

فضا،

از بوی عُفنِ انهدام آکنده‌ست.

ببین، خانه با اوراقِ هویتِ جعلی

چگونه موجودیت محتضرش را جار می‌زند، همچو یک مُرداب!

پرده‌ها،

پرده‌هایِ بی‌خبر از پرنده‌بودن

خورشیدهای پنجره را

به برزخِ تاریکی تبعید کرده‌اند

و چراغِ آیینه، خاموش است

غریوِ مسافرانِ گمشده‌ی دریاها را می‌شنوی؟!

چنان چون سنگ... چون خاکم

من زمینم!

ایستاده‌ام در آستانه‌ی عطش

و گیاهِ «آزادی» را

به‌سانِ توتمی کهن

در امن‌ترین نقطه‌ی قلبم

و پنهان‌ترین زوایایِ ذهنم

تقدیس می‌کنم.

نیایش می‌کنم

با واژه‌های پُر کبوتر

و سکوتی آبی.

ایستاده‌ام در آستانه‌ی عطش

سراپا خیس!

پلک‌هایم

زیر سُم‌ضربه‌ی اسب‌هایِ سرکشِ اندوه، متورّم‌اند

مانندِی آن کشتزارِ آبستن

که دل از مائده‌هایِ آسمان بُرید.

چه پرتگاهِ کُشنده‌ای‌ست ایوانِ انتظار

ببین جسدِ ثانیه‌برگ‌هایِ پاییزی

چگونه در حیاطِ خانه می‌پوسند!

در آستانه‌ی عطش

سراپا خیس ایستاده‌ام

افق‌های امتداد مسدودند

و دشتِ هوا زیر پرده‌های مِه، قُرُق گشته‌ست.

خَلَنگ‌زارانِ پنجره کو؟

چکادِ بلندِ آفتاب کجاست؟

نمی‌بینی میله‌ها و زنجیرها، مارشِ وقاحتِ خود را

چه گستاخانه می‌نوازند؟

حکایت، دیرگاهی چنین بوده‌ست

و من اینک

در آستانه‌ی عطش

ایستاده‌ام

بی چشم‌داشتنِ یاری از «یار»ی.

آری! هیچ انگاشته‌ام

فرمانِ توقّف را

و تمرّد کرده‌ام از قانونی غریزی

که آدمی را وادار می‌سازد

تا خود را در ارتفاعِ حقیرِ لذّت‌ها

مصلوب گردانَد.

آن زنجره‌ی شفّافِ پیوسته را می‌بینی

که با پاکی‌ها

با نورها و رودها پیوندی دیرینه دارد؟!

آن هجای زیبا را می‌شنوی

کز تپه‌هایِ ناپیدایِ اما سبز

چگونه می‌وزد، و می‌تازد

تا فراز آید، و با خونم درآمیزد؟!

پس آفتاب را دوباره «سلام» خواهم گفت

و بذرهای سکوت در تنم جوانه می‌زنند

آزادی را درودی می‌فرستم

و گُلبرگ‌های سرخِ اشتیاق، در رگانم خواهند شکُفت

عشق را سرودی دوباره خواهم ساخت

و خوشه‌های آواز، با نسیمی که در روحِ من جاری‌ست

به رقص برمی‌خیزند؛

تا داس‌ها و مترسک‌ها

به ابدیّتِ فراموشی‌ای گُنگ و مبهم پرتاب شوند.

... آه! من چه سرشارم

وقتی که

رؤیا، در تنِ اشیاء حُلول می‌کند

و رسالتِ رودخانه

آغاز می‌گردد...

از دریچه‌هایِ بازِ آیینه پیداست

آن غریبه‌ی کوچکِ غمگین

که در آن سوی افق‌هایِ پُر شکوفه‌ی صبحگاهان

شادمانه، سرود تازه‌ای را بازخواهد خواند

و آشنا خواهد بود با ما.

به آیینه بنگر، تا فردا را در آن بازیابی!

پرده‌ها می‌سوزند

و چشمانِ خاطره در کوچه‌پس‌کوچه‌های بن‌بست

سرگردانند.

پرده‌ها می‌سوزند

و دستانِ شومِ حادثه

در دوردستِ سراب، ترسان و هراسانند.

بالِ صدف‌ها، رو به روشنا گشوده است

و مرغانِ دریایی، نغمه‌ی خود را سَر داده‌اند.

شماره کُن!

ساحلِ حیاطِ پشتیِ خانه،

پُر از جنازه‌های بادکرده است

پُر از جادّه‌هایی که به هیچ‌کجا ختم‌اند.

و من، اکنون میان فوّاره‌های روشن

سراپا خیس از پرتوِ خورشید

سنگلاخِ تاریک را به سوی آن‌جا که باید،

درمی‌نوردم...

گُل سرخی را کشف کرده‌ام در آتش

گُل سرخی را کشف کرده‌ام در آتش.

## ❊ لوورانەیل دۆایین ۲

لەناو دڵەیل ئێمە، ئەڤین و هیوا و هەڵقوڵان هەس

لەناو دڵەیل ئێمە، وڵاتێگ ئەول داربەڕۆەگان قەۆێ

مانگ ورشەدار کۆەسان و کیەنییەیل پاکێ هەس

لەناو دڵەیل ئێمە، کاکەشانێگ لە هەست تاسەبزوێن ئازادی

زەردەخەنە، درسی و راس‌ئۆشی هەس

ئوو هەڵبەت، گولە و برینێگ وەسنگ ئێ هەمگە!

## ❊ زمزمەهای آخرین ۲

در قلب‌هایِ ما، عشق و امید و جوشش هست

در قلب‌هایِ ما، سرزمینی با بلوط‌هایِ تناورش

ماهِ درخشانِ کوهستان و چشمه‌هایِ پاکش هست

در قلب‌هایِ ما، کهکشانی از حسِ شوق‌انگیزِ آزادی

لبخند و صداقت هست

و البته، گلوله و زخمی برای این همه!

## ❊ گوورانییەیل پایزەێ شاخان

ئاواز چیا، دەنام دڵم بەرزەو بوودن و

ئەرواێ دەلیاگان، خزێیە ناو گووش‌ماسیی لەشم!

دووم ڤە پاییز... ئەرێ! پاییز

پڕاوپڕ ئەژ ویتەویت بەلۆزار

... ئوو وە سەرپەنجەیل وژ، ژە رەنگ چنێکەم وا.

## ❊ ترانه‌های پاییزیِ کوهستان

نغمه‌ی کوهستان، در دلم می‌پیچد

و روحِ دریاها، در گوش‌ماهیِ تنم حُلول می‌کند!

پاییز می‌شوم... آری! پاییز

پُر از زمزمه‌ی بلوطزار

... و باد با سرانگشتانش، مرا از رنگ می‌چیند.

## ❊ دەمتەقەی سێ و ئسپێ و زەرد و سۆر

ـ "..."

ـ "..."

ـ "..."

ـ "..."

"نە! هەوەجە وە وەرگێڕ و ئەڵگەردانن نییە"

چەوەیلمان یە وە یەکتری وەتن.

## ❊ دیالوگِ سیاه و سپید و زرد و سُرخ

ـ «...»

ـ «...»

ـ «...»

ـ «...»

«نه! نیازی به دیلماج و ترجمه نیست»

این را چشم‌های ما به هم گفتند.

## ❁ هەڵاڵە زەردەیل میزۆپۆتامیا

ئەێ وا!
بۆشە ژنە بەێتئەڵوەسەگەێ شیراز
کراس زەرد بکەێدە وەر هەڵوەس
هەنایَ لەبارەێ هاوسا زاگرۆسییەگەێ هەڵوەسێد.
لێرە، تەنانەت گامەیل رووباریش زەردن
کوچگ، وە لاوەلاوەێ زەرد زەمان، چوودە خەو
کۆە، وە بڵووزەیل زەرد پاییز، خەمین خوەنێد و
هەڵاڵەیل، وە پژنگ و سەروەن زەرد کوردییان،
وە هەڵپەڕگە دچنە پیری سووا
وەی خەیاڵە ک بەشکا هەر ئی سووە وهار بوو
...وهار سوور و سەوز!
ئەێ بایَ!
بیشە ژنە بڤەشەکەێ دەشت و ناوڕووەل پڕ سازوئاڤاز ئاناتۆلی
دەناو وشە وە وشەێ هەڵبەسەیل زەرد،
سەفەرنامەێ ئاهیی چەوەیلێ [وە یادگار بێلێ]
ئەڵ هەر کرێ ژەێ، بەرف کوتوپڕ لێوەخەنەێ و
ئەڵ هەر بەرزبیین و نیشتنەوەێ پێنووس،

**جگێ لە لۆل زلْف مەدیتەرانە**

**ڤە یادگار بێلیێ**

**چۆن ک لە ولْاتەکەێ زەرد م، وەهار ماوەێ فرەێکە نەهاتێیە**

**هەلْالْەیل، چەوەڕێین و**

**زام کۆ نائارامە و بیێتاوی کەد**

**ــ فێر داربەلییەیل پیر بکە!... چ سەرەتاتگی دکەن**

**پەێ دیین تەنانەت یەێ جوڕەپووپنەێ فرەڤەش! ــ**

**ئەێ ڤا!**

**بووشە ژەنە هەلْبەستڤانەکەێ هەزار و یەک شەو بەغدا**

**هەریە گ ئەڕا کەشکۆ ئەتر چەویر و نەعنا بارێ، بەسە**

**چۆن ک ئێ نام ڤلْاتەکەێ زەرد م،**

**تەنانەت گولْووماو گوجین لاوانن و لێڤەخەنەێک**

**ئەر ئاشکرایی هوشکەڕوو زەمەلمان مەلْهەمە**

**چۆن ک ئیمە، ژە نام رەنگینییەل کەشکەشانەکەێ کەلْن ئەڤین،**

**فرەتر خوەشمان ئەژ لێڤەخەنە ماێ...**

**هەرچەن تەنانەت نزیکترین لێڤەخەنەیژ،**

**دەسمەڕەسترین هەسارە [ئەێ نام ئاسارەل] بوو.**

**ولْاتەگەێ من، پڕە لە جوڕەپووپنەیل لالْ**

**هەر وەی بوونەوە، شێعر بالْەوگرتن بهوونەوە**

**ئەیٚ ژنە بۊییشەگەیٚ شیراز!**

**جورەپووپنەیل، لە قسیەیٚ تو ک ئەڵگەردان رەوان ئاسمانە،**

**خاس رەسنەو.**

**ڤڵاتەکەیٚ م، پڕ ئەژ ئاوەخت و ئارزووەل گومبییەو**

**هەیٚ ڤەی مدووە، ئەڵبەس دڵت بخۆ**

**ئەیٚ ژنە بۊەشەکەیٚ**

**دەشت و ناوڕووەل پڕ ساز و سروو ئاناتۆلی!**

**ئارەزووەیل، وەرد داڵانەگەیٚ تووئەڵتوو دڵ ت**

**ک وەرەو رووژنا ئەوکریاێە،**

**ئاشنان.**

**وڵاتەکەیٚ م، نەتڵ پەژارەیل زەردە**

**ئەسە، هەڵبەس واران بخوەن**

**ئەیٚ ژنە بوێژەکەیٚ بیٚناو و کەسنەناس بەیرووت و شام!**

**پەژارەیل زەرد جەهان، زڕدۊت ئەسرەیل تونن**

**ـ ک ئەڵ پشت و ئەۊلایٚ ئانە، شایی رووژەیل بانان نیشتێیەـ**

**وڵاتەگەیٚ من، زەردە**

**زەرد، وەرد دەنگ سمکوو ئاسکەیل تێژپا و گورج ژان**

**زەرد، وەگەرد وەفر کوتوپڕ خەما**

**زەرد، وەل لۊل نەرم گیسەیل شیرازا**

**زەرد، ڤگەرد زەێتوونەل مێرەبان مەدیتەرانە**

**هەنیٚ شانەیل بریندار چیا ماچ کەن.**

**لە وڵاتەکەیٚ من، وەی هەمکە کەژاڵ و کانی و سروەیٚ زەردە**

**بەڵام، وەهار سوور و سەوز ها کوو؟!**

**وەهارەگەیٚ سوور و سەوز ئێمە هەڵبوەس**

**ئەیٚ ژنە هەڵبەستڤانەکەیٚ هەزار و یەک شەو کەسەر!**

**دە ڤڵاتەکەیٚ م،**

**تەنیا بایێە ک بیٚ گوزەرنامە و ڤیزا سەفەر کەریٚ!...**

**بیٚ رێدان و وشکانن.**

**لە وڵاتەکەیٚ من، "میزۆپۆتامیا"**

**ئازادی، ژنە خوداوەن خوەتەنڕەژیدەێکە**

**ک لە زەردەخەنەیٚ ئەو ئەسارەیٚ دۆۆۆۆۆۆرە**

**وە دەسماڵەگەیٚ زەرد ئایر، هەڵپەڕکە کەد**

**ئوو رووژێگ، لە هەر کات و سات شێعر، دنیایٚ و**

**گرد ئاسۆگەل ژە بووخوەش چەویر و نەعنا، پڕەو کەیٚ.**

**دە ڤڵاتەکەیٚ من،**

**هەر ژنە بەێتئەڵوەس خەمبار جەهان**

**هەڵبەسەیل زەرد فرەیٚ چنیٚ و**

**سەوەتەکەیٚ خوەیٚ پڕاپڕ ئەژ لەۆەخەنە دەریٚ**

پڕاپڕ ژە هەڵاڵە سوورەیل

ئەڕا شەوییەگەێ سەوز خەوەیلێ

تا کشکڵە زەڕەدار و ڕەنگینەکەێ ڕووژەیل بانان

بووخوەش هەزوەیل کۆیی ڤڵاتەکەێ م بێ

بوو ئازادی... بوو دووسی... ئەتر ئەڤین!

پاش دمایین چای هەر ئی ئێوارەێ دڵتەنگ‌کەر و خەمبارە

ڤە چەمەدانێگ پڕ ژە هەڵاڵە زەردەیل

ئەژ ئیسگاێ زەرد و وەجاهێشتەێ چووڵێ

سەفەر مەکەم ڤرەێ ڤهار...

ئوو ڤهار بەم ئەڕا لێوارەیل مەدیتەرانە،

ئڕا دەروازەیل شیراز،

ڤەر دڵەکەێ ڕپڕەپکەر "ئۆرووک"!

بلیت وا گرتمە و

گوزەرنامەێ سۆر هەڵبەس

دەناو گیرفان کراسەکەێ زەردم، مۆر کریاێە.

... قەتار زەردێ، لە وەر واران وە فیکەکیشانەو تێد

ئاهـ هـ هـ !... شیراز چەنێ نزیکە و

زەێتۆن‌زار دیەکەگەێ هامسا، چ مێمان‌دووس!

## ❊ لاله‌های زردِ مزوپوتامیا

ای باد!

به شاعره‌ی شیراز بگو

پیراهنِ زرد بر تنِ شعر کند

وقتی از همسایه‌ی زاگرسی‌اش می‌سُراید.

اینجا، حتی قدم‌های رودخانه هم زردند

سنگ، با لالاییِ زردِ زمان، به خواب می‌رود

کوه، با شعله‌های زردِ پاییز، غمگنانه می‌خواند

و لاله‌ها، با شال و دستارِ زردِ کُردی‌شان،

رقص‌کُنان به پیشوازِ فردا می‌روند

با این خیال که شاید همین فردا بهار باشد

...بهارِ سُرخ و سبز!

ای باد!

به شاعره‌ی جلگه‌های پُر ساز و آوازِ آناتولی بگو

در واژه واژه‌های شعرهای زرد،

سفرنامه‌ی آهویِ چشم‌هایش را

در هر سطرش، برفِ ناگهانِ لبخندش را

و در هر فراز و فرودِ قلم،

اندکی پیچشِ گیسویِ مدیترانه را

به یادگار نهد

چرا که در سرزمینِ زردِ من، بهار دیری‌ست نیامده

لاله‌ها، چشم‌به‌راه‌اند

و زخمِ کوه بی‌تابی می‌کند

ـ به بلوط‌های پیر نگاه کُن!... چه سرک می‌کِشند

برای دیدنِ حتی یک چکاوکِ پُرحرف! ـ

ای باد!

به شاعره‌ی هزار و یک شبِ بغداد بگو

همین‌که برای کوهستان عطرِ آویشن و نعنا بیاورد، بس است

چرا که در سرزمینِ زردِ من،

حتی برکه‌ی کوچکِ نوازش و لبخندی

بر صراحتِ کویرِ زخم‌هایمان مرهم است

چرا که ما، از میانِ زیبایی‌های کهکشانِ بزرگِ عشق،

لبخند را خوش‌تر می‌داریم...

اگرچه حتی نزدیک‌ترین لبخند نیز،

دست‌نیافتنی‌ترینِ ستاره‌ها باشد.

سرزمینِ من، پُر از چکاوک‌های لال است

پس، شعرِ پرواز را بسُرا

ای شاعره‌ی شیراز!

چکاوک‌ها، حرفِ تو را که ترجمه‌ی روانِ آسمان است،

خوب می‌فهمند.

سرزمینِ من، پُر از آرزوهای گم‌شده است

پس، شعرِ قلب‌ات را بخوان

ای شاعره‌ی جلگه‌های

پُر ساز و سرودِ آناتولی!

آرزوها، با هزارتویِ قلبِ تو

که به سویِ روشنا گشوده است،

آشنایند.

سرزمینِ من، خیسِ غم‌های زرد است

پس، شعرِ باران را بخوان

ای شاعره‌ی گمنامِ بیروت و شام!

غم‌های زردِ جهان، دخترخوانده‌ی اشک‌های توأَند

ـ که در پسِ آن‌ها، شادیِ فرداها نشسته است ـ

سرزمینِ من، زرد است

**زرد، با سُم‌ضربه‌هایِ آهوانِ سریعِ درد**

**زرد، با برفِ ناگهانِ غم**

**زرد، با پیچشِ نرمِ گیسوانِ شیراز**

**زرد، با زیتون‌هایِ مهربانِ مدیترانه**

**وقتی بر شانه‌هایِ زخمیِ کوه بوسه می‌زنند.**

**در سرزمینِ من، با این‌همه آهو و چشمه و نسیمِ زرد**

**اما، بهارِ سُرخ و سبز کو؟!**

**بهارِ سُرخ و سبزِ ما را بسُرا**

**ای شاعره‌ی هزار و یک شبِ اندوه!**

**در سرزمینِ من،**

**تنها باد است که بی پاسپورت و ویزا سفر می‌کند!...**

**بی اجازه و تفتیش.**

**در سرزمینِ من، «مزوپوتامیا»**

**آزادی، الهه‌ای‌ست با سرشتِ زیبایِ بی‌نیاز از آرایش**

**که در لبخنده‌ی آن ستاره‌ی دووووووور**

**می‌رقصد با دستمالِ زردِ آتش**

**و روزی، در هر آنِ شعر، خواهد آمد**

**و تمامِ افق‌ها را از عطرِ آویشن و نعنا، خواهد آکند.**

در سرزمینِ من،

هر شاعره‌ی غمگینِ جهان

شعرهای زردِ بسیاری خواهد چید

و سبدش را پُر از لبخند خواهد بُرد

پُر از لاله‌های سُرخ

برای پیراهنِ سبزِ خواب‌هایش

تا دخترکِ زیبای فرداها

بویِ خوشِ آویشن‌های کوهیِ سرزمین مرا بدهد

بویِ آزادی... بویِ دوستی... عطرِ عشق!

بعدِ آخرین چایِ همین عصرِ دلگیر

با چمدانی پُر از لاله‌های زرد

از ایستگاهی زرد و متروک

به بهار سفر خواهم کرد...

و بهار خواهم بُرد به کرانه‌های مدیترانه،

به دروازه‌های شیراز،

به قلبِ تپنده‌ی «اوروک»!

بلیطِ باد را گرفته‌ام

و پاسپورتِ سُرخِ شعر

**در جیبِ پیراهنِ زردم، مُهر خورده است.**

**... قطاری زرد، در باران سوت‌کشان می‌آید**

**آهه!... شیراز چقدر نزدیک است**

**و زیتون‌زارِ دهِ همسایه، چه مهمان‌دوست!**

## ❁ماڵەگەێ خوەر

هێز گر و وەناو دڕگ‌جاڕ نووتەک گومان
کڵپە و بڵێزەێ وەگوڕ ئیمان بوو
ک ئەژ زام تین
تا سارێژ ئاو
تەنیا، گرم‌هڕێک مەنێیە.
وەناو قایخ خەیاڵ، پاڕووەگەێ دڵ بوەشن
ک لە گێژاو دڵەڕاوکەێ دڵووپە
تا لێوار هێمنی و ستار دەلیا
چراێ مزگانی‌دەر ئەوین، ها خەوەر و ورياس.
بژنەو!
کڵەشێرەگەێ بەیان، قوڵنێ:
"تا کەفتن و شکیان شەو
تەنیا، سەنگەرێ ماگە".
جەنگاوەر، هەنگاو هەڵگر [پا بنە!]
ماڵەگەێ خوەر نزیکە.

## ❋ خانه‌ی خورشید

برخیز و اندر خارزارِ ظُلمانیِ تردید

شُعله‌ی پُرشورِ ایمان باش

که زخمِ تشنگی را

تا شفایِ آب

تنها، تُندری مانده‌ست.

بزن پاروی دل، در قایقِ رؤیا

که از گردابِ تلواسه‌ی قطره

تا ساحلِ آرامشِ دریا

چراغِ مژده‌بخشِ عشق، بیدار است.

بشنو!

خروسِ صبح، می‌خواند:

«تا سقوطِ شب

تنها، سنگری باقی‌ست».

جنگاور، قدم بردار [بشتاب!]

خانه‌ی خورشید نزدیک است.

## ئارێنا

هەریە بەسە بێشی "ئەرێ"!

تەنیا هەریە بەسە

تا دە رزگ ئانی بوویی.

گاڵتەجاڕەل گرێڤنەو،

ڤەسنگ پریکپاک سەروەرەل

یا دەمەل ئەڵچەقەنە،

ئەڵ گەلیی هاوخۆنەل [ـ کەس و کیژەل]

... تەنیا هەریە بەسە برانگ

هەریە بەسە بێشی: "ئەرێ"!

## * آرِنا

کافی‌ست بگویی «آری»!

تنها همین کافی‌ست

تا در زُمره‌ی آنان باشی.

دلقکانی گریان،

محضِ قاه‌قاهِ سَروَران

یا دهان‌هایی دریده،

بر گلوی هم‌خونان

... تنها همین کافی‌ست برادر

کافی‌ست بگویی: «آری»!

## ❊ تەل هشکبییەێ خێیاڵ

ڤە دەشت ڤتم: ڤەرچە مەخمینی؟

ــ تەرم چەم، ڤرەڤ مرداو دەرم.

ــ چەم!... بەڵۆم ئاخر ژچە؟

ــ ئاخ! تەنیا گڕێ

گڕێ تەنیا، ڤە گومۆنێ دەریاێ کیەو ئەفسانەێکە.

وە ئاسمان وەتم: ئڕا گیرە کەید؟

ــ کەلاک پەلەوەر، ئەڕاێ وڵات بەرد و بێدەنگی بەم.

ــ پەلەوەر!... ئەمانگ ئاخر ئڕاچە؟

ــ ئاخ! تەنیا گڕێک

گڕێک تەنیا، خوەێ نەخستە ناو مەترسیی باڵگرتنەوە.

وە زەمین وتم: ئەڕا موور چڕید؟

ــ خوڵەکوو باخ، ئسپارمە دارتەرم وا.

ــ باخ!... بەڵام ئاخر وەسەر چە؟

ــ ئاخ! تەنیا دەمێک

دەمێک تەنیا، وە گومانێ وێشیی خێیاڵ وهار نیەچنیەێدەو.

ڤە بەێتئەڵڤەس ڤتم: ڤەرچە زوێری؟

ــ لەشەکەێ پیک مرۆڤ، دمە گڵکوو فراموشی.

ـ مرۆڤ!... بەڵۆم ئاخر ئەڵسەر چە؟

ـ ئاخ! تەنیا گڕێ

گڕێ تەنیا، ئەژ ئەڤین ئازادی بڕیا و کەفتەۊ گەرد گەنی.

## ❋ شاخه‌ی خشکیده‌ی رؤیا

دشت را گفتم: از چه رو غمگینی؟

ـ جنازه‌ی رود را به جانب مُرداب می‌برم.

ـ رود!... اما چرا آخر؟

ـ آه! تنها دَمی

دَمی تنها، دریایِ آبی را افسانه‌ای پنداشت.

آسمان را گفتم: از چه رو گریانی؟

ـ نعشِ پرنده را به سرزمینِ سنگ و سکوت می‌برم.

ـ پرنده!... اما چرا آخر؟

ـ آه! تنها دَمی

دَمی تنها، پرواز را خطر نکرد.

زمین را گفتم: از چه رو مویه‌گری؟

ـ خاکسترِ باغ را به تابوتِ باد می‌سپارم.

ـ باغ!... اما چرا آخر؟

ـ آه! تنها دَمی

دَمی تنها، خوشه‌ی رؤیایِ بهاری را ناچیدنی انگاشت.

شاعر را گفتم: از چه رو محزونی؟

ـ جسدِ پوکِ انسان را در گورِ نسیان می‌نهم.

ـ انسان!... اما چرا آخر؟

ـ آه! تنها دَمی

دَمی تنها، از عشق به آزادی گسست و با بدی پیوست.

## ❊ چریکەێ ئاگرین

ئاسن، گوڵوەچ دەرکەێد و
پەنجەرەێگ وە پانایی بسکەخەنەێک
لە رۆچگ گرژ ئێ دیوارە سەوز کەێ
ئاخ ئەگەر تەنیا جارێگ، قوڕگت گوڕ بگرێ
لەی زمسان لاڵ بنبەسە!

## ❊ آوازِ آتشین

آهن، شکوفه می‌زند
و پنجره‌ای به وسعت یک لبخند
بر چهره‌ی عبوسِ این دیوار می‌روید
آه اگر تنها یک بار، حنجره‌ات گُر بگیرد
در این زمستانِ لالِ بُن‌بست!

## ❊ بڵنگای سەوز

بنووڕە سێدارەیل
وەتۆم ک جوگرافیاێ نیشتمانەگەم
پڕ وێشەس!
گرمهڕـ وشەێ "نە"
لە دەم من بژنەو؛
وەتۆم...
وەتۆم ک هەواێ نیشتمانەگەم
لاسامە و واوەڕووەس!
بڵێنیی نیشتمانەگەم بۆن
چ
"بە
رز
تر"
ژە ئاست زەلکاویی ئیوەس
ئاغاێ دادوەر!
... فڕین م نیەوینی؟!

## * ارتفاعِ سبز

دارهایِ اعدام را بنگر

گفته بودم که جغرافیایِ میهن‌ام

پُر بیشه‌ست!

رعد ـ واژه‌ی «نَه» را

بشنو از دهانِ من؛

گفته بودم...

گفته بودم که هوایِ میهن‌ام

توفانی‌ست!

ببین ارتفاعِ سرزمین‌ام را

چه

«با

لا

تَر»

از سطحِ مُردابیِ شماست

آقایِ قاضی!

... پروازِ مرا نمی‌بینی؟!

## ❊ ئێوارەیٚ رووداوەکە

خار ئەدەن

جوور تریشقە؛

نەڕنن

وە وێنەیٚ وا؛

تا لە بن وێشەیل تەمین

رووداوەکە بنیشنن دە مکوڵ رووژگار گەن و

پرۆسک زام دڵێیان

وە یەیٚ جارە، بووارن.

... ئەریٚ!

چوار سووار کورد

ئەڵ کووڵ ئەسپ زەرد گرژی و تووڕەییان

وە پڕتاو

وەرەو ئەوراز زاگرۆس

بڵێسە دەن.

## ❋ عصرِ حادثه

می‌تازند

چونان برق؛

می‌غرّند

چونان باد؛

تا در عمقِ بیشه‌هایِ مه‌گرفته

حادثه را در کمینِ روزگارِ بد بنشانند

و شرارِ زخمِ قلب‌شان را

به یک‌بار، ببارند.

... آری!

چهار سوارِ کُرد

بر پشتِ مَرکبِ زردِ غَضَب و خشم‌شان

به تاخت

رو به بُلندایِ زاگرس

شعله می‌کشند.

## ❊ ڤیر پڕ تاسەیٚ وێیەردە

چەترەکەیٚ زەردت ئەوکردی
هەنیٚ ژە لاکیچە تاریکەگەیٚ زمسان پلیای ــ
گوڵەبەڕووژەیٚ ئەڵ شوون خوەر بین!
گرد یە دین
دەروەچەل
دۆکەڵگیرەل
شەقامەل.
دەناو زڵەزڵ جەماوەر
دەناو دەلیا دەلیا لەف
لۆ کردن دو باڵنە دەناو نێیەت
یەکیٚ ئمیٚ
یەکیٚژۆ خەم!
گرد یە دین
وایٚ سەرد
پەلەکەیٚ ریت درەخت
دارتەێلەل.
پەنجە بیچگەکەت گورمچەو کردی

پڕووشەوەفرەیل دەنام هڵم و گڕەێ هناسەیلت تاویان
زەردەخەنە کردی ئەڕا ئاسمان
ئەڕا زەق
ئەڕا جەماوەر
ئمجا دەنگ هاوارت وەردێیان بەرزەو کردی:
"بژی ئازادی!"...
"ئمرێ چەکمەبوور!"...
گولە و ئاگر بی
خۊن بی و قیلتاو.
گرد یە دین
دەروەچەیل
شەقامەیل
پەلەکەێ ریت درەخت.
سی ساڵ وێیەرد
دەمەڵوەس ملهوڕەکەێ چەکمەبوور نوویش کەفت
بەڵام سوورەگوڵەکەێ دەنگ ت
هێمانیش جوور بڵێسەێگ ئاگر
ئەڵ ناوڕاس ئاسمان کەو شار
باڵەتەپە کەرێ!

گرد یە دڤینن

م

ڤەگەرد دو باڵنە ک دەناو نێیەم لۆ کردنە

یەکێ ئمێ

یەکێژۆ خەم!

## ❋ نوستالژی

چترِ زردتو وا کردی

وقتی از پس‌کوچه‌ی تاریکِ زمستون پیچیدی ــ

آفتابگردونی پیِ خورشید بودی!

اینو همه دیدن

پنجره‌ها

دودکشا

خیابونا.

میونِ غُلغلِ جمعیت

میونِ دریا دریا موج

آشیون کردن دو پرنده تویِ نگات

یکی امید

یکیشون غم!

اینو همه دیدن

بادِ سرد

شاخه‌ی لختِ درخت

تیرایِ برق.

مشتِ کوچیکتو گره کردی

دونه‌برفا توی ِ هُرمِ نَفَسات آب شدن

لبخند زدی به آسمون

به زمین

به جمعیت

بعد فریادتو همراهشون سَر دادی:

«زنده‌باد آزادی!»...

«مرگ بر دیکتاتور!»...

گلوله بود و آتش

خون بود و آسفالت.

اینو همه دیدن

پنجره‌ها

خیابونا

شاخه‌ی لختِ درخت.

سی سال گذشت

نقابِ دیکتاتورِ تازه هم افتاد

اما گُل سرخِ صدایِ تو

هنوز هم مثِ یه شعله‌ی آتیش

**وسطِ آسمونِ کبودِ شهر**

**پَرپَر می‌زنه!**

**اینو همه می‌بینن**

**من**

**با دو پرنده که تویِ نگام آشیونه کردن**

**یکی امید**

**یکیشون غم!**

## ❊ گوورانیی چریک

ئەوین، هەڵفڕینە

دەلیا، ئاسمان هەڵفڕین دڵووپەیلە

وەداخا، ک لە نەبۆن گەورەێ ئەوین

مرۆڤ، مرداو خەون و خەیاڵەیلە!

ت ئەی ژە لانەماێ کانییەگان و چەمەگان، چریک!

وە چریکەێ تفەنگەکەێ تۆڕەیی و گرژیی خوەد

گوورانییێک ئەڕاێ ئەوین... گوورانییێک ئەڕاێ ژیان بخوەن

شەوانە لە بڵێنای کەش و چیاێ دۆر.

بەشکەم هەم بچەقن،

لەناو رەگەیل شەکەت و کەو زەێن مەردمان شار

هەڵاڵە سوورەیل نۆر.

## * ترانه‌ی چریک

عشق، پرواز است

دریا، آسمانِ پروازِ قطره‌هاست

دریغا، که در فقدانِ بزرگِ عشق

آدمی، مردابِ رؤیاهاست!

تو ای ز نسلِ چشمه‌ها و رودها، چریک!

با نوایِ تفنگِ خشمِ خود

ترانه‌ای برای عشق... ترانه‌ای برای زندگی بخوان

شبانه بر فرازِ کوهِ دور.

باشد که باز بشکُفند،

در رگانِ خسته و کبودِ ذهنِ مردمانِ شهر

لاله‌های سرخِ نور.

